چیرۆکی منداڵان و مێرمنداڵان

# ڕێـوی سەرسوڕهێنەر

## ڕۆڵد داڵ

وەرگێڕ
نەسرین ئەحمەد





پێشکەشە بە

گوڵی باخەکەم تابان گیان

کە هەر لە ئێستاوە

حەز لە خوێندنەوە و نووسینی

چیرۆك دەکات




**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی**

● **رێویی سەرسوڕهێنەر** (زنجیرەی چیرۆکی منداڵ و مێرمنداڵان)

● **رۆڵد داڵ**

● **وەرگێڕ: نەسرین ئەحمەد**

● نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ: **رێدار جەعفەر**

● نرخ: (٢٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم ٢٠١٤

● تیراژ: (٧٥٠) دانە

● چاپخانە: **موکریانی** (هەولێر)

● **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٣٠٦) ساڵی(٢٠٤)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨٢٨)**





**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

## سەبارەت بە نووسەر

رۆلد دالٚ نەرویجی بوو، بەلاّم لە بەریتانیا لە دایك ببوو، هەر لە وێش خوێندنی تەواو کرد. لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بۆ کارکردن لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی **شێل** چوو بۆ ئەفریقیا. لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی دووهەمی جیهانی، وەك فرۆکەوانی جەنگی چوو بۆ ناو هێزی ئاسمانی بەریتانیا، لە لیبیا و یۆنان و سوریا خزمەتی کرد. دوای ماوەیەك لە واشینگتۆن بە پلەی جێگری پەیوەندیی کاری سیاسی، لە هێزی ئاسمانی دەست بەکار بوو، هەر لەو کاتەشەوە خەریکی نووسینی کورتە چیرۆك بوو کە ناوبانگێکی زۆری پێدەرکرد. رۆڵد دالٚ بە شێوەیەکی کۆمیدی و جوان، لە کەش و هەوایەکی تێکەڵ لە خەیال و راستی و وێچواندن، باسی پرسە پەروەردەیە کۆمەڵایەتییەکانی نەوەی نوێ دەکات. شێوەی نووسینەکانی نابراو زۆر دەوڵەمەند و شادی بەخشن. چیرۆکەکانی دالٚ ئاوایەکی توندو هێرشبەر، هاوکات شیرین و سەرنج راکێشیان هەیە، وشە بە وشە خوێنەر بە دوای خۆییاندا رادەکێشن. ناوبراو یەکێکە لە سەرکەوتووترین نووسەری کتێبی منداڵ و

مێردمنداڵان، کە منداڵانی سەرتاسەری جیهان کتێبەکانی ئەویان خوێندۆتەوە و، زۆربەی خەڵاتە بەناو بانگەکانی جیهان بەو کتێبانە بەخشراون.

بەرهەمەکانی ناوبراو بریتین لە: **چارلی و کارخانەی چکولیات**، **جادووگەرەکان**، **ماتیلدا**، **سەفەری تەنیا**، **کۆخی زەبەلاح**، **دەرمانی ئەفسوناوی**، **خێزانی جەنابی گەمژە**، **ڕێوی سەر سوڕهێنەر**، **ساڵی من**، **چارلی و گەورە بالابەری شوشەیی**، **دێنی پاڵەوانی جیهان**، **دێوەزمەی میهرەبان**، کوڕ. تێکڕای ئەو کتێبانە لە لایەن چاپخانەی(**نشر مرکز**) بڵاوکراونەتەوە.

چاپخانەی(نشر مرکز) چوار کۆمەڵە کۆورتە چیرۆکی بڵاوکردۆتەوە، کە بۆ تەمەنی گەورەترن، بە ناوەکانی: **ژنی خاوەن ماڵ**، **دوێنێ جوان بوو**، **خاتونی من کۆترەکەم** و **خزمەتکار**.

# سێ خاوەن مەزرا

خوارووی دۆڵەکە، سێ مەزرای لێ بوو، خاوەنەکانیان سێ وەرزێڕی سەرکەوتوو بوون. زۆر دەوڵەمەند وەلێ پیاو خراپیش بوون. رەنگە ئێوەش کەسانی ئاوا خراپ و خۆپەرستتان دیبێت. ناوەکانیان بریتی بوو لە خاوەن مەزرایان، **بوگیس**، **بونیس** و **بین**.



بوگیس بەخێوگەی پەلەوەری هەبوو. خاوەنی هەزاران مریشك بوو. بە شیوەیەکی ترسناك قەڵەو بوو، چونکە هەموو رۆژێك بەیانی و نیوەرۆ و ئێوارە، بۆ هەر ژەمێك مریشکێکی کوڵاوی دەخوارد کە ناوئاخن کرابوو بە کۆمەڵێك شت.

بونیس بەخێوکەری مراوی بوو. خاوەنی هەزاران قازو مراوی. کورتەباڵایەکی ورگ زل! ئەوەندە کورتە باڵا بوو لە تەنکاوترین مەلەوانگەی جیهاندا مەلەی بکردایە، تا چەناگەی نقووم دەبوو. خواردنی کێك و جگەری قاز بوو. جگەرەکانی دەکردە ناو شلەیەکی ناخۆش و لە دواییدا ئەو شلەیەی لە ناو کێکەکان دەئاخنی. ئەم شێوازەی نان خواردنی ئەو، دەبوو بە هۆی ئەوەی هەم ژانە سك بگرێت و بەردەوام رەوشتی توند و دڕندانە بێت.





**بین** باخی سێوی هەبوو بەخێوکەری قەلیش بوو. هەزاران عەلەشیشی لە باخە پڕ دارو درختەکەی هەبوو. ئەو هەرگیز نانی نەدەخوارد. لە بری نانخواردن، دەبەی ئاوی سێوی هەڵدەلوشی کە لە سێوەکانی باخەکەی دروستی دەکرد. باریکەلە و لاواز بوو، بەڵام لە هەردوو خاوەن مەزراکانی تر زیرەکتر بوو.

ئەوە بوگیس و بونیس و بینن

زرتەزلە و کورتەبالاّ و باریکن

تابلێی ساختەچی و بەڕواڵەت جیاوازن

هەرسێکیان خۆپەرست و وەك یەك فیڵبازن.

ئەم هۆنراوەیە وێردی سەرزاری منداڵان بوو، کاتێك ئەوانیان دەبینی، کۆدەبوونەوەو بە گۆرانی دەیانوتەوە.



## مام ڕێوی

لە سەرووی دۆڵەکەوە، لەسەر گردێك، دارستانێك هەبوو. ناو دارستانەکە درەختێکی گەورەی لێبوو. لە ژێر درەختەکە کونێك هەبوو. لە ناو ئەو کونە مام ڕێوی و ڕێوی خانم، لەگەڵ چوار بەچکە ڕێوی دەژیان. شەوانە هەر کە دنیا تاریك دادەهات، مام ڕێوی بە هاوسەرەکەی دەوت: دەی ئازیزم! ئەمجارەیان چی بهێنم؟ مریشکێکی قەڵەوی بوگیس؟ مراوی یان قازێکی بونیس؟ یان عەلەشیشێکی زۆر باشی بین؟

دوای ئەوەی ڕێوی خانم دیفەرموو چی پێویستە، مام ڕێوی خۆی دەخزاندە دەرەوەو بەو تاریکەشەوە بەرەو دۆڵەکە دەرۆیشت، ئیتر لەوێ خۆی میوانداری خۆی دەکرد.

بوگیس و بونیس و بین زۆر باش دەیانزانی چ باسە، لە بەر توڕەیی خوێنیان وەکوڵ دهات. ئەوان لەو کەسانە بوون مەحاڵ بوو هیچ شتێك لەدەست بدەن، چ



بگاتە بەوەی شتێکیان لێ بدزرێت. لەبەر ئەوە، هەموو شەوێ هەریەکە و تفەنگەکەی خۆی هەڵدەگرت و، لە شوێنێکی تاریکی ناو مەزراکە خۆی حەشاردەدا، بەو هیوایەی دزەکە بگرن.

بەڵام مام رێوی زۆر لەوان زیرەکتر بوو. هەموو کاتێ لەو لایەوە لە مەزراکە نزیك دەبۆوە کە با بە ئاڕاستەی دەم وچاوی بێ، بەو مانایەی بۆنی هەرکامێك لەوانەی لە تاریکی خۆی حەشار داوە، بە دەم باوە بگاتە لووتی مام رێوی. لەو کاتەی بەرێز بوگیس لە پشت بەخێوگەی ژمارە یەك خۆی حەشاردابوو، مام رێوی لە دووری پەنجا مەترەوە بۆنی دەکرد، و بە خێرایی رێگەی خۆی دەگۆڕی بەرەو بەخێوگەی ژمارە چوار، کە لە لایەکی تری مەزراکە بوو.

بوگیس هاواری کرد: نەفرەت لەو ئاژەڵە پیسە!

بونیس وتی: پێم خۆشە جەرگ و دڵی بێنمە دەرەوە!

بین هاواری کرد: دەبێ بکوژرێت!

بوگیس وتی: بەڵام چۆن؟ بۆ خاتری خوا یەکێك پێمان بڵێ چۆن ئەو نەفرەتیەی بگرین؟

بین بە یەکێك لە پەنجە درێژەکانی لووتی سڕی و وتی: پلانێکم هەیە.

بونیس وتی: تۆ هیچ کات پلانێکی باش و تۆکمەت نەبووە.

بین وتی: بێدەنگ بەو گوێ بگرە. سبەی شەو ئێمە لە دەوری ئەو کونەی ڕێویەکەی تێدایە، خۆمان حەشار دەدەین. سەبر دەگرین هەتا دێتە دەروە و دواتر... زرمەی لێدێنین...

بونیس وتی: زۆر ژیرانەیە! بەڵام یەکەم جار دەبێ کونە ڕێویەکە بدۆزینەوە.

بینی زیرەك وتی: بونیسی ئازیز! من پێشتر ئەوکونەم دۆزیوەتەوە. لەو سەرەوە، لە ناو دارستانی سەرەوەی گردەکە لە ژێر درەختێکی گەورە دایە...

## تەقە کردن

مام ڕێوی وتی: دەی ئازیزم! ئەمشەو حەزت لە چییە؟

ڕێوی خانم وتی: وابزانم مراوی بۆ ئەمشەو باشە. ئەگەر دەکرێ دوو مراوی قەڵەومان بۆ بێنە. یەکێك بۆ من و تۆ ئەویتریش بۆ منداڵەکان.

مام ڕێوی وتی: مراوی، لەو مراویە خڕ و خوولانەی بونیس.

ڕێوی خانم وتی: زۆر وریابە.

مام ڕێوی وتی: ئازیزم! من لە دووری یەك کیلۆ مەترەوە هەست بە بۆنی ئەو گێلانە دەکەم. بەرادەیەك، دەتوانم بۆنی هەر یەکەیان لەویتر جیا بکەمەوە. بوگیس بۆنی پێستی مریشکی بۆگەن دەدات. بونیس بۆنی جگەری قاز و، دەوروبەری بین پڕە لە بۆنی ئاوی سێو، کە لە بۆنی گازە ژەهراویەکان دەچێت.



رێوی خانم وتی: بەڵێ، بەڵام هۆشیارو بە ئاگابە، بۆ خۆشت دەزانی لە وانەیە هەر سێکیان چاوەڕوانی تۆ بن.

خەمت نەبێ، دوایی دەتبینمەوە.

خۆ ئەگەر مام رێوی بیزانیبا، ئەو سێ خاوەن مەزرایە لەو کاتەدا لە کوێ چاوەڕوانی دەکەن، بەو دڵنیاییەوە قسەی نەدەکرد. ئەوان دروست لەبەردەمی کونەکە چاوەڕوانی بوون و هەر یەکەیان لە پشت درەختێك، بە خۆیان و تفەنگەکانیانەوە هەڵتوتەکابوون. لەگەڵ ئەوەشدا شوێنەکەیان بە باشی هەڵبژاردبوو، تا دڵنیا بن با بۆنی ئەوان نابا بۆلای کونە رێویەکە. لە راستیدا بایەکە بە پێچەوانەوە هەڵیکردبوو. ئەستەم بوو بۆنەکەیان بگاتە بەر لووتی مام رێوی.



مام ڕێوی لە تونێلە تاریکەکەیەوە خۆی خزاندە زالکی کونەکە.

دەم و چاوە درێژو سەرنج ڕاکێشەکەی لەو شەوە تاریکە بردە دەرەوە بۆنی کرد. کەمێك خۆی خزاندە پێشەوەو ڕاوەستا. دیسان بۆنی کردەوە. مام ڕێوی هەموو کاتێك بە تایبەتی ئەو کاتەی لە کونەکە دەهاتە دەرەوە، زۆر سەرنجی دەوروبەری خۆی دەدا. کەمێکی تر ڕۆیشتە پێشەوە. نیوەی پێشەوەی جەستەی ڕێویەکە لە دەرەوەی کونەکە بوو.

لمبۆزە ڕەشەکەی بەملاو بەولادا دەگێڕا، ئەملایەی بۆن کرد، لایەکەی تری بۆن کرد تا بۆنی مەترسی دۆزیەوە. هەستی بە مەترسی نەکرد بەڵام کە ویستی ڕاکاتە ناو دارستان، دەنگێکی لاوازی بیست یان وای هەست کرد کە بیستویەتی. دەنگێکی زۆر لاواز، وەك ئەوەی کەسێك بە ئارامی پێ لەگەڵای وشك بنێت.

مام ڕێوی خۆی بە ئەرزەوە نوساند و بە ئارامی درێژ بوو گوێیەکانی ڕاست کردەوە. ماوەیەکی زۆر خۆی مات کرد بەڵام هیچی تری گوێ لێ نەبوو.

لەبەر خۆیەوە وتی: لەوانەیە مشکێکی بیابانی بووبێت یان ئاژەڵێکی بچووکی تر. کەمێکی تر خۆی خزاندە دەرەوەی کونەکە...دواتر دیسان کەمێکی تر بۆ پێشەوە. ئێستاکە دەتوانین بڵێین بە تەواوی لە دەرەوەی کونەکەیە. بۆ دوایین جار بە باشی سەیری دەوروبەری خۆی کرد. دارستان تاریك و بێدەنگ بوو. مانگیش لە ئاسماندا دەدرەوشایەوە.

هەر لە هەمان کاتدا چاوە تیژەکانی مام ڕێوی بریقەیەکی بەدی کرد، لە پشت درەختێك کە زۆر دوور نەبوو لێی. تالێکی زیوینی تیشکی مانگە شەو، لەسەر شتێکی بریسکەدار دەدرەوشایەوە. مام ڕێوی لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیڕوانی، بە بێ هیچ جوڵەیەك درێژ ببوو. ئەو شتە چییە؟ خەریکە دەجوڵێتەوە. وردە وردە دێتە سەرەوە... ئەی خوایە! خۆ لولەی تفەنگە! مام ڕێوی وەکو با خۆی خزاندە ناو کونەکەو هەر لەو کاتەشدا دارستانی دەوروبەری تەقیەوە. زرمب، زرمب، زرمب.

دوکەڵی هەر سێ تفەنگەکە بەو شەوە بەرزبۆوە. بوگیس و بونیس و بین لە پشت درەختەکان هاتنە دەرەوەو ڕۆیشتنە لای کونە ڕێویەکە.

بین وتی: لێمان دا؟



یەکێکیان تیشکی لایتەکەی بردە لای کونە رێویەکە، لەوێ لەسەر زەوی لە ژێر نوری لایتەکە، پاشماوە خوێناویەکەی...کلکە رێوییەك نیوەی لە دەرەوەو نیوەی لە ناوەوەی کونەکە، کەوتبوو، بین کلکەکەی بلّند کرد. ئێمە لە کلکیمان داوە. بەلاّم بۆ خۆی ڕای کردوە. کلکەکەی بە لایەکدا هەلّدا.

بوگیس وتی: نەفرەتی! درەنگ تەقەمان لێکرد. دەبوو ئەو کاتەی سەری هێنابوو دەرەوە تەقەمان لێ بکردایە.



بونیس وتی: ئیتر وازوو سەری ناهێنێتەوە دەر. بین تەرمۆزەکەی لە باخەلی دەرهێناو قومێك ئاوی سێوی خواردەوە. دواتر وتی: بەلانی کەمەوە سێ ڕۆژ دەخایەنێ کە ئەو زۆر برسی بێت و دیسان بێتە دەرەوە. ئەمن ناتوانم لێرە دانیشم و چاوەڕوان بم. وەرن ئێرە هەڵکەنین و بیهێنینە دەرەوە.

بوگیس وتی: ئاخ! راستە. ئێمە لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا دەتوانین بیهێنینە دەرەوە. خۆ ئێمە دەزانین شوێنەکەی لە کوێیە.

بونیس وتی: پێموایە خێزانێکی چەند کەسی لە خوارەوە لە ناو کونەکەدان.

# خاکەنازە ترسناکەکان

لە خوارەوەی ناو کونەکە، ڕێوی خانم بە هێواشی سەری کلکە بڕاوەکەی مام ڕێوی دەلستەوە، تا خوێنەکەی بوەستێ. لەگەڵ لستنەوەی کلکەکەدا وتی: ئەو کلکە لەو ناوچەیەدا بێ وێنە بوو.

مام ڕێوی وتی: ئازاری هەیە!

دەزانم کە ئازاری هەیە، ئازیزم! بەڵام بەم زووانە باشتر دەبی.

یەکێك لە بەچکە ڕێویەکان وتی: باوکە بەم زووانە کلکێکی نوێ دروست دەبێتەوە.

مام ڕێوی وتی: هەرگیز دروست نابێتەوە. من دەبێ تا دەمرم بە بێ کلکی بمێنمەوە. ڕێوی زۆر غەمگین دیار بوو.



ئەو شەوە ماڵی مام رێوی بێ خواردن سەریان نایەوە، منداڵەکانیان هەر زوو خەویان لێ کەوت. لە دواییدا رێوی خانم خەوی لێ کەوت. بەڵام مام رێوی نەیدەتوانی بخەوێت، چونکە شوێنی برینی کلکەکە ئازاری هەبوو. بیری کردەوە: باشە، بە گشتی بەخت یاوەرم بوو کە زیندووم. ئێستا ئەوان کونەکەی ئێمەیان دۆزیوەتەوە. دەبێ بە زووترین کات ئێرە بە جێ بێڵین. لەمەو دوا ئاسودەیی بە خۆمانەوە نابینین. ئەگەر ئێمە... ئەویتر چییە؟

خێرا ئاوڕی دایەوە گوێی ڕاگرت. ئەو دەنگەی بیستی ترسناکترین دەنگ بوو کە رێویەك دەیتوانی بیبیسێت- دەنگی خشە خشی ئەو خاکەنازانە بوو کە خەریکی هەڵکەندنی ئەرزەکە بوون.

هاواری کرد: هەستن! ئەوانە خەریکی هەڵکەندنی ئەرزەکەن تا پەلکێشی دەرەوەمان بکەن.

خانمی رێوی یەکسەر هەستاو لە کاتێکدا کە هەموو گیانی دەلەرزی دانیشت. بە هێواشی وتی: دڵنیای؟



دڵنیام، گوێ بگرە!

ڕێوی خانم هاواری کرد: ئەوانە منداڵەکانمان دەکوژن.

مام ڕێوی وتی: هەرگیز.

ڕێوی خانم هاواری کرد: بەڵام ئازیزم! ئەوان ئەو کارە دەکەن. تۆش دەزانی کە ئەو کارە دەکەن.

خرتە! خرتی خاکەنازەکان لەسەر سەریان دەنگی دەهات. هاتنە خوارەوەی وردکە بەردو خۆڵ و خاشاك لە سەقفی کونەکە دەستی پێکرد.

یەکێك لە بەچکە ریویەکان پرسیاری کرد: دایکە! ئەوان بە چ شێوەیەك دەمانکوژن؟

چاوە رەش و خڕەکانی لە ترسان گەورەتر بوون. ئایا سەگەکان دەمانکوژن؟

رێوی خانم دەستی کرد بە گریان. ئەو هەر چوار بەچکەکەی لە خۆی کۆکردەوەو بە توندی بە خۆیەوە گوشین.

لە ناکاو دەنگی خرتە خرتێکی گەورەتر لە سەر سەریانەوە بیستراو، سەرە تیژەکەی خاکەنازێك دروست لە ناوەندی سەقفەکە دەرکەوت. ئەو دیمەنە ترسناکە وەکو تەزوی کارەبا کاریگەری لەسەر مام رێوی هەبوو. یەکسەر خۆی هەڵداو هاواری کرد: تێگەیشتم! وەرن، زووکەن! نابێ یەك خولەکیش بە فیرۆ بدەین. بۆ چی پێشتر ئەوە بە بیرمدا نەهاتبوو!

کام بیرە، باوکە؟

مام رێوی لەکاتێکدا دەستی بە هەڵکەندن کردبوو هاواری کرد: رێوی خێراتر لە مرۆڤ دەتوانی ئەرز هەڵکەنێت. هیچ کەسێك لە جیهاندا ناتوانێ لە رێوی خێراتر ئەرز بکۆڵێت.

هەرکە مام رێوی دەستی کرد بە هەڵکەندن، تا بە دەستەکانی گیانی ئازیزی رزگار بکات، کەرسەکە گلەکان روویان لە هەموو لایەك کرد.

رێوی خانم هاتە پێشەوە تا یارمەتی بدات. چوار بەچکە رێویەکەش دەسبەکار بوون.



بڕۆن بۆ لای خوارەوە، مام ڕێوی فەرمانی کرد: ئێمە دەبێ بچینە قوڵایی ئەرزەوە. چەندە قووڵتر بێ باشترە!

تونێلەکە درێژترو درێژتر دەبۆوە و بە سەراوژێریەکی زۆر بەرەوخوار دەچوو. ژێر ئەرزەکە قوڵترو قوڵتر دەبوو. دایك و باوك و هەر چوار بەچکەکە بەیەکەوە هەڵیان دەکەند. دەستەکانیان وەها خێرا دەجوڵاند کە نەدەبینرا. وردە وردە دەنگی خرتە خرتی خاکەنازەکان لاوازو لاوازتر دەبوو.

دوای کاتژمێرێك مام رێوی دەستی لە هەڵکەندن هەڵگرت و وتی: بەسە، هەموویان راوەستان. ئەوان گەرانەوەو سەیری ئەو تونێلە گەورەیان کرد کە هەڵیان کەندبوو. بێدەنگیەکی تەواو باڵی بەسەرداکێشان.

مام رێوی وتی: ئۆخەی وابزانم سەرکەوتین. ئەوان هەرگیز ناتوانن بگەنە ئەم قوڵاییە. دەست خۆشی بۆ هەمووان!

هەموو دانیشتن تا پشوویەك بدەن. رێوی خانم بە منداڵەکانی وت: ئێوە دەبێ باش بزانن، ئەگەر باوکتان نەبایە ئێستا هەموومان مردبووین. باوکتان رێویەکی سەرسوڕهێنەرە.

مام رێوی سەیرێکی هاوسەرەکەی کرد و ئەویش پێکەنی. کاتێك کە خانمی رێوی دەدوا، مام رێوی هەستی دەکرد پتر لە جاران خۆشی دەوێت.

## تراکتۆرە ترسناکەکان

ڕۆژی دواتر سەر لە بەیانی کاتی کە خۆر هەڵدەهات، بوگیس و بونیس و بین هێشتا هەر خەریکی هەڵکەندن بوون. ئەو کونەی کە هەڵیان کەندبوو هێندە گەورە بوو کە جێگای خانویەکی تێدا دەبۆوە. بەڵام هێشتا نەگەیشتبوونە کۆتایی تونێلەکە. هەرسێکیان زۆر ماندوو توڕە بوون.

بوگیس وتی: نەفرەتی! ئەم بیرۆکە گێلانە هی کێ بوو؟

بونیس وتی: بیرۆکەی بین بوو.

بوگیس و بونیس هەردووکیان سەیری بین یان کرد. بین بێ ئەوەی خولقی ئەوانی تر بکات، قومێکی تر ئاوی سێوی خواردەوە، تەرمۆزەکەی خستەوە ناو باخەڵی. دواتر بە توڕییەوە وتی: گوێ بگرن! من ئەو ڕێویەم دەوێت. هەر دەیگرم. تا لەسەر دەرگای ماڵەکەم وەك پارچە گۆشتێك هەڵینەواسم، دەست هەڵناگرم.

بوگیسە قەڵەو وتی: گومانی تێدانییە ناتوانین بە هەڵکەندنی زەوی بیگرین. من لە هەڵکەندن ماندوو بووم.

بونیسە کورتەی سك زل، سەیری بینی کردو وتی: باشە، بیرۆکەیەکی گێلانەی ترت نییە؟



بین وتی: دەڵێ چی؟ گوێم لێ نییە. بین نەك هەرگیز خۆی نەدەشوشت، بەڵکو دەست و دەم وچاویشی تەڕایی ئاویان بەرنەدەکەوت. هەر بۆیە هەردوو کونە گوێیەکانی، بە چڵك و چەوری و بنێشت مێشەمردوو و هەندێك شتی لەو بابەتە، قەپات ببوو. لە ئاکامدا کەڕ ببوو. بە بونیسی وت: قایمتر قسە بکە. بونیس هاواری کرد: بیرۆکەی گێلانەی ترت نییە؟

بین پشتە ملی خۆی بە پەنجە چڵکنەکانی خوراند. پشتە ملی بین زیپکەیەکی پڕ لە جەراعەتی لێهاتبوو کە بەردەوام دەخورا. وتی: ئەو شتەی کە ئێمە پێویستمانە بۆ ئەو کارە، ئامێرە...بێڵی میکانیکی، ئێمە بە خاکەنازی کارەبایی لە ماوەی پێنج خولەك پەلکێشی دەکەینە دەرەوە. بیرۆکەیەکی باش بوو، دوو کەسەکەی تریش لە گەڵیدا هاوڕا بوون.

بین فەرمانی کرد: باشە دەی، بوگیس! تۆ لێرە بمێنەوەو رێگە مەدە رێویەکە ڕابکات. ئەمن و بونیس دەرۆیین ئامێرەکان دێنین. ئەگەر ویستی بێتە دەرەوە بە فیشەك لێی بدە.

بینی باریك و درێژ کەوتە رێ. بونیسی وردیلەش بە دوایدا. بوگیسە قەڵەویش تفەنگەبەدەست بەرەو کونە رێویەکە راوەستابوو.

دوای ماوەیەکی کەم بین و بۆنیس، بە خۆیان و دوو تراکتۆری **کاترپیلاری** زەبەلاحەوە گەڕانەوە، پێشەوەی تراکتۆرەکان بێڵی میکانیکی پێوەبوو، کە بەر درەختەکانی دارستانەکە دەکەوتن دنگ دنگ دەنگیان دەهات.



بین یەکێك لەو دوو تراکتۆرانەی لێ دەخوڕی و ئەوی تریشیان بونیس. رەنگی هەردوو ئامێرەکە رەش بوو، وەکە دوو دێوەزمەی دڕندە دەهاتنە بەرچاو.

بین هاواری کرد: باشە دەی، بابرۆین.

بونیس بە دەنگێکی بەرز وتی: مردن بۆ رێوی!

ئامێرەکان خەریکی ئیش کردن بوون. ئەوان قەپاڵیان لە گردەکە دەگرت و پارچەی گەورە گەورەیان لێ دەکردەوە. ئەو درەختە گەورەی کە مام رێوی لە ژێریدا کونەکەی هەڵکەند بوو، وەکو دەنکە شقارتەیەك هەڵدرا بە لایەکدا. خڕکە بەردەکان بەملاو ئەولادا فڕێدەدران و درەختەکان دەکەوتنە سەر زەوی. دەنگی ئەوئامێرانە گوێی کەڕ دەکرد.

لە خوارەوەی ناو تونێلەکە رێویەکان هەڵتوتەکابوون، گوێیان لەو دەنگە دەنگە گرتبوو کە لە سەرەوە دەهات. بەچکە رێویەکان هاواریان کرد: باوکە! ئەوە چی روو دەدات؟ دەیانەوێ چی بکەن؟

مام رێوی نەیدەزانی ئەوانە خەریکی چین و چی روودەدات.

رێوی خانم هاواری کرد: بومەلەرزەیە!

یەکێك لە بەچکە رێویەکان وتی: سەیر کەن تونێلی ئێمە کورتتر بۆتەوە! من روناکی خۆر دەبینم.

هەموویان ئاوڕیان دایەوە، راست بوو، دووری زالکی تونێلەکە لە مەترێك کەمترە و، لە پشت سەریانەوە، دوو تراکتۆری گەوریان دیت لە تیشکی خۆر گیرابوون.

مام رێوی بە دەنگێکی بەرز وتی: تراکتۆرەکان، بێڵی میکانیکی! بۆ رزگار کردنی گیانتان هەڵکەنن! هەڵکەنن! هەڵکەنن!

## کێبرکێ

ئێستاکە کێبرکێیەکی زۆر سەخت دەستی پێکردبوو، ئامێرەکان لە بەرامبەر ڕێویەکان، سەرەتا گردەکە بەم شێوەی خوارەوە بوو:



لە دوای کاتژمێرێك کە ئامێرەکان خۆڵ و خاشاکی زۆرو زۆرتریان لە گردەکە هەڵکەند. گردەکە بەم شێوەی لێهات:



هەندێك جار رێویەکان لە هەڵکەندندا پێش دەکەوتن و دەنگی دنگ دنگ لاوازتر دەبوو و مام رێوی وتی: خەریکە سەردەکەوین. من دڵنیام کە سەردەکەوین. بەڵام دوای چەند چرکەیەك، دیسان ئامێرەکان دەهاتنەوە و، خرتە خرتی بێڵە بە هێزەکان تا دەهات زیاتر دەبوو. رێویەکان یەك جار سەری تیژو کانزایی یەکێك لەو بێڵانەیان لە پشت سەری خۆیان دیت، کە زەویان دەتاشی.

مام رێوی بە هانکە هانکەوە وتی: ئازیزانم، بەردەوام بن! بێ هیوا مەبن!

بوگیسە قەڵەو بەسەر بونیس و بین دا هاواری کرد: بەردەوام بن! هێندەی نەماوە بیگرین.

بین وەڵامی دایەوە: هێشتا نەتبینیوە؟

بوگیس قیژاندی: نەخێر هێشتا ماوە! بەڵام وا بزانم نزیك بووینەوە!

بونیس هاواری کرد: بە بێڵەکە پەلکێشی دەرەوەی دەکەم. لەت لەتی دەکەم.
ئامێرەکان تا نیوەڕۆ بەردەوام خەریکی ئیش کردن بوون. ڕێویە داماوەکانیش هەروەها. ئێستا گردەکە بەم شێوەی لێهاتووە:



خاوەن مەزراکان ئەوەندە تامەزرۆ بوون ڕێوییەکان بگرن، بۆ نان خواردنیش وچانیان نەدا و کارەکەیان ڕانەدەگرت.
بونیس لەو کاتەی کە خۆی دولا کردبۆوە بەسەر تراکتۆرەکەدا: هاواری کرد! هۆی مام ڕێوی! ئێستاکە دێین و دەتگرین!

بوگیس قیژاندی: ئەوە دوایین جارە مریشکەکانم دەخۆی، ئیتر ناتوانی بگەڕێیتەوەو جارێکی تر سەر بە مەزراکەمدا بکەی.

ئەو سێ کەسە شێت ببوون. بینی رەقەلەو درێژ و بونیسە قولەو ورگ زل، ئامێرەکانیان وەك درندە لێدەخوڕی و کێبڕکێیان دەکرد، بێڵە میکانیکییەکان بە خێرایەکی لە رادەبەدەر زەویان دەکۆڵی. بوگیسە قەڵەویش وەك دەروێش هەدادانی نەبوو، دەپارایەوەو هاواری دەکرد: قایمتر! قایمتر!

تا نزیك کاتژمێر پێنجی دوای نیوەرۆ، ئەم بەڵایەیان بەسەر گردەکە هێنا.



ئەو چاڵەی ئامێرەکان هەڵیان کەندبوو، وەکو زالکی گڕکانی لێهاتبوو. دیمەنەکەی هێندە نائاسایی بوو، کە خەڵکێکی زۆر لە لادێیەکانی دەوروبەر هاتبوون بۆ تەماشا کردن. ئەوان لەسەر لێواری قۆڵتەکە راوەستابوون و چاویان لە بوگیس و بونیس و بینەوە بڕیبوو. ئۆی بوگیس! چی بووە؟

ئێمە بە دوای رێویەکدا دەگەڕێین!

ئێوە شێتن!

خەڵکەکە هاواریان دەکردو پێدەکەنین، بەڵام ئەو کارە دەبوو بە هۆی ئەوەی، کە ئەو خاوەن مەزرایانە توڕەتر، منجرترو سورتر بن، کە تا رێوێیەکەی نەگرن واز لە کار کردن نەهێنن.

## هەرگیز ناهێڵین دەرباز بێت

کاتژمێر شەشی ئێوارێ، بین مۆتۆری تراکتۆرەکەی کوژاندەوەو دابەزی، بونیسیش هەروەها. بە ئەندازەی پێویست کاریان کردبوو. ئەوان بە درێژایی ئەو رۆژە تراکتۆریان لێخوڕی و ماندوو شەکەت ببوون، برسیشیان بوو. وردە وردە هاتنە سەر کونە رێویەکە، لە کۆتایی چاڵە گەورەکە. دەم و چاوی بین لەبەر توڕەیی سور هەڵگەرابوو. بونیسیش دەستی کرد بە جنێودان کە شیاو نین بۆ نووسین، جنێوی بە رێویەکە دەدا، بوگیس بە لۆژە لۆژ هات و وتی: رێوی چەپەڵی نەفەرەتی! ئێستا دەبێ چی بکەین؟

بین وتی: پێتان دەڵێم کە نابێ چی بکەین! نابێ بهێلین دەرباز بێت.

بونیسیش وتی: هەرگیز، هەرگیز، هەرگیز!

بین دوولا هاتەوە بۆ سەر کونە رێویەکە و هاواری کرد: گوێت لێ بوو مام رێوی! هێشتا تەواو نەبووە، مام رێوی! تا کەلاکت هەڵنەواسین، ناگەڕینەوە ماڵێ!

دواتر هەر سێکیان بەڵێنیان داو زۆر بە جیدی سوێندیان خوارد تا رێویەکەی نەگرن ناگەرێنەوە بۆ مەزرا.

بونیسە خڕەی ورگ زل، پرسی: دواتر دەبێ چی بکەین؟



بین وتی: تۆ دەنێرینە خوارێ تا رێویەکە بێنی بۆ سەرەوە. برۆ خوارێ، خڕەی بەدبەخت! بونیس ڕای دەکردو دەی قیژاند: نا، من نا!

بین زەردەخەنەیەکی نابەدڵی کرد. کاتیك کە پێدەکەنی، پوکە سورەکانی بەدەر دەکەوتن. لە بری ددانیش هەر پوکی بەدەرەوە بوو. وتی: ئێمە تەنیا رێگەیەکمان لەبەردەمدا ماوە، دەبێ کارێکی وا بکەین لە برسان بێتە دەرەوە. لێرە خێوەتی هەڵدەدەین و بەشەو بەرۆژ ئاگامان لە کونە رێویەکە دەبێت. لە کۆتاییدا هەر دێتە دەر، ناچارە بێتە دەرەوە.

هەر بۆیە بوگیس و بونیس و بین پەیامیان نارد تا لە مەزراکانیان چادر، کیسە خەو و خواردنیان بۆ بێنن.

## ڕێویەکان برسی دەبن

ئێوارەی هەمان ڕۆژ، سێ خیوەتیان لە ناو قۆڵتێك لەسەر گردەکە هەڵدا، یەکێکیان بۆ بوگیس، یەکێکی تر بۆ بونیس و ئەویتریش بۆ بین. خێوەتەکان چواردەوری کونە ڕێویەکەیان گرتبوو، هەر سێ خاوەن مەزراکانیش لە دەرەوەی خێوەتەکان دانیشتبوون و، خەریکی خواردنی نانی ئێوارە بوون. بوگیس سێ مریشکی ئاخنراو بە هەندێك کەرەستەی خواردەمەنی خوارد، بونیس شەش کێکی پڕکراو بە شلە ناخۆشەکەی جگەری قازەوە خوارد و بینیش دوو دەبەی ئاوی سێوی فڕکرد. هەر سێکیان تفەنگەکانیان لە تەنیشت خۆیان دانابوو.

بوگیس مریشکێکی کوڵاوی هەڵگرت کە هاڵاوی لێ هەڵدەستا، بردی بۆلای کونە ڕێویەکەو هاواری کرد: بۆنەکەت بۆ دێت، مام ڕێوی؟ مریشکێکی ناسك و بە تام! بۆچی نایەی دانەیەکی ببەی؟

بۆنی مریشکە کوڵاوەکە گەیشتەخوارەوەی تونێلەکە، لەو شوێنەی کە ڕێویەکان هەڵتوتەکابوون.

یەکێك لە بەچکە ڕێویەکان وتی: ئاخ باوکە! ناتوانین بە هیواشی بڕۆینە سەرەوەو پڕی دەینیێ؟

ڕێوی خانم وتی: هەر بیریشی لێ مەکەوە! ئەوانیش هەر ئەوەیان دەوێت.

بەچکە ڕێویەکان هاواریان کرد: بەڵام زۆرمان برسییە. چەندی تر دەخایەنێ تا شتێکمان دەست دەکەوێ و بیخۆین؟

دایکیان وەڵامی نەدایەوە. باوکیشیان وەڵامی نەدایەوە. هیچ وەڵامێکیشیان پێی نەبوو تا پێیان بڵێن.



کاتێك دنیا تاریك بوو، بونیس و بین لایتەکانی پێشەوەی هەردوو تراکتۆرەکانیان بەرامبەر بە کونە ڕێویەکە هەڵکرد. بین وتی: ئێستا دەبێ بە نۆرە

ئێشك بگرین. یەكێك پاسەوان دەبێت و دووانەكەی تر دەخەون، تا ڕۆژ دەبێتەوە بەو شێوەیە بەردەوام دەبین.

بوگیس وتی: ئەگەر ڕێویەكە ئەرز بكۆڵێت و لە لایەكی تری گردەكە بێتە دەرێ چی؟ ئەتۆ بیرت لەو مەسەلەیە نەكردبۆوە، وا نییە؟

بین وا خۆی دەرخست كە پێشتر بیری لەو مەسەلەیە كردۆتەوە و وتی: ئەی چۆن پێشتر بیرم لێ كردۆتەوە!

بوگیس وتی: دەی زووكە ڕێگە چارەكە بڵێ.

بین یەكێك لەو شتە ڕەش و پیسانەی لە گوێی دەرهێنا و فڕیدا دواتر پرسیاری كرد: چەند كەس لە مەزراكەتدا كار دەكەن؟

بوگیس وتی: سی و پێنج كەس

بونیس وتی: من سی و شەش كەسم هەیە.

بین وتی: من سی و حەوت كەسم هەیە. كە هەموویان بەیەكەوە دەبنە سەدو هەشت كەس.

دەبێ ئێمە پێیان بڵێین گەمارۆی گردەكە بدەن. هەریەكەیان دەبێ چەك و لایتی بەدەستەوە بێت. لەو حاڵەتەدا هیچ ڕێگایەك نامێنێتەوە بۆ دەرباز بوونی مام ڕێوی.

فەرمانەكە گەیشتە مەزراكان، هەر ئەو شەوە سەدو هشت كەس، بازنەیەكی توند و تۆڵیان بە دەورەی گردەكەدا دروست كرد. ئەوان بە دار، تفەنگ و تەورو

دەمانچەو شتی ترسناکی تر چەکدار ببوون. هەر بۆیە ئەستەم بوو، ڕێوی یا هەر ئاژەڵێکی تر بتوانێ لە گردەکە دەرباز بێت.

ڕۆژی دواتریش چاودێری و پاسەوانی هەر بەردەوام بوو. بوگیس و بونیس و بین، لەسەر کورسیە بچکۆلانەکەی خۆیان دانیشتبوون و چاویان لە کونە ڕێویەکە بڕیبوو. ئەوان زۆر نەدەڕوان. تەنیا لەوێ دانیشتبوون و تفەنگەکانیان لەسەر قاچیان دانابوو.

مام ڕێوی جار جار لە زالکی تونێلەکە نزیك دەبۆوە و بۆنی دەکرد، دواتر دەخزی و دەگەڕایەوە و دەیوت: ئەوان هێشتا هەر لەوێن.

ڕێوی خانم پرسیاری کرد: تۆ دڵنیای؟

مام ڕێوی دەیوت: دڵنیام، دەتوانم لە ماوەیەکی زۆر دووردا، بۆنی بین بکەم. ئەو بۆنی لێدێت.

# مام رێوی پلانێکی هەیە

ئەو گەمەیە سێ شەو سێ ڕۆژ بەردەوام بوو.

رۆژی سێیەم بوگیس وتی: رێویەك چەندە بە بێ نان و ئاو هەڵ دەکات؟

بین پێی وت: لەوە زیاتر ناتوانێ، بە زووترین کات دێتە دەر. دەبێ بێتە دەرەوە.

بین راستی دەکرد. لە ناو تونێلەکە لە خوارەوە، رێویەکان خەریك بوو لە برسان دەمردن.

یەکێك لە بەچکە رێویەکان وتی: خۆزگە دەمانتوانی چۆرێك ئاو بخۆینەوە. ئاخ باوکە! هیچت لەدەست نایەت؟

باوکە! ناتوانین هێرش بەرین؟ لەوانەیە بەمجۆرە رزگارمان بێت، وانییە؟

رێوی خانم بە دەنگێکی بەرز وتی: هیچ ریگەیەك نییە بۆ دەرباز بوونمان.





ڕێگە نادەم برۆنە دەرێ، لێرە بمێننەوەو بە ئارامی بمرن پێم باشترە لەوەی کە برۆنە بەر گوللەی ئەوانە.

مام ڕێوی دمێك بوو هیچ قسەیەکی نەکردبوو. بە ئارامی دانیشتبوو چاوەکانی قوچاندبوو و ئاگای لە قسەی ئەوانی تر نەبوو. ڕێوی خانم دەیزانی مام ڕێوی بێ ئۆمێدانە هەوڵدەدا، ریگەیەك پەیدا بکات تا برۆنە دەرەوە. ڕێوی خانم سەیری هاوسەرەکەی کرد، بینی بە دەوری خۆیدا سوڕایەوە و، بە هێواشی قاچەکانی بەرز کردەوە. مام ڕێوی سەیری هاوسەرەکەی کرد. لەبەر خۆشحالی چاوی دەدرەوشانەوە.

ڕێوی خانم خێرا پرسیاری کرد: چی بووە ئازیزم؟

مام ڕێوی بە هێواشی وتی: بیرۆکەیەکم بۆ هاتووە.

بەچکە رێویەکان هاواریان کرد: چی؟ ئاخ باوکە! چ بیرۆکەیەك؟

رێوی خانم وتی: زووکە! دەی بیڵێ!

مام رێوی وتی: باشە...کەمێك وەستاو ئاخێکی هەڵکێشا و بە داخێکەوە سەری راوەشاند. دیسان دانیشتەوە. نەخێر، سوودی نییە، جێبەجێ ناکرێت.



بۆچی باوکە؟

چونکە دیسان دەبێ هەڵکەنین و ئێمەش لە دوای سێ شەوو سێ رۆژ برسێتی، توانای ئەوەمان نییە کە دووبارە دەست بکەینەوە بە هەڵکەندن.

بەچکە رێویەکان هاواریان کرد: ئێمە دەتوانین باوکە! ئەوان خێرا چوونە لای باوکیان. ئێمە دەتوانین! تۆش دەتوانی!

مام رێوی بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری چوار بەچکەکەی کرد. لە دڵی خۆیدا وتی منداڵەکانم چەند باشن. سێ رۆژە هیچیان نەخواردوە، خەریکە لە برسان

دەمرن کەچی هێشتا ورەیان بەرزە. ناهێلم بێ ئومێد بن و گوتی: من... من پێموایە دەتوانین تاقی بکەینەوە.

وەرن دەست پێبکەین، باوکە! پێمان بڵێ دەبێ چی بکەین!

ڕێوی خانم بە ئارامی هەستایە سەر پێ. ئەو لە هەمووان برسیتر و تینوتر بوو. زۆر لاواز ببوو. وتی: ببورن! بەڵام پێموایە من ناتوانم یارمەتیەکی باشتان بدەم.

مام ڕێوی وتی: ئازیزم! ئەتۆ هەر لەوێ بمێنەوە. بۆ خۆمان جێبەجێ دەکەین.

## بەخێوگەی پەلەوەری ژمارە یەکی بوگیس

مام ڕێوی ئاماژەی بۆ خوارەوە کردو وتی: ئەمجارەیان، دەبێ بۆ لایەکی دیاریکراو بڕۆین. لەبەرئەوە لەگەڵ منداڵەکانی جارێکی تر دەستی کردەوە بە هەڵکەندن. کارەکەیان بە هێواشی بەڕێوە دەچوو. لەگەڵ ئەوەشدا کارەکەیان بوێرانە ئەنجام دەدا و تونێلەکە بەرە بەرە گەورەتر دەبوو.



یەکێك لە بەچکەکان وتی: باوکە! خۆزگە ئێمەش دەمانزانی بۆ کوێ دەڕۆین.

مام ڕێووی وتی: نەخێر، پێتان ناڵێم بۆ کوێ دەچین. چۆن ئەو شوێنەی بۆی دەچین هێندە باشە ئەگەر ئێستا پێتان بڵێم، لە خۆشیان تێکدەچن، دواتریش

ئەگەر سەرکەوتوو نەبووین (کە ڕێژەی سەرکەوتنیش زۆرە)، لە بێ ئومێدیدا دەمرن، من نامەوێ زۆر دڵخۆشتان بکەم، ئازیزانم!

هەموویان بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ خەریکی هەڵکەندن بوون، نەیاندەزانی چەندی خایاندووە، چونکە لە خوارەوەو لە ناو ئەو تونێلە تاریکە شەو ڕۆژ دیار نەبوو. مام ڕێوی وتی: پێم باشە ئێستاکە تەماشایەکی سەرەوە بکەین بۆ ئەوەی بزانین لە کوێین. من دەزانم دەمەوێ بۆ کوێ برۆم، بەڵام دڵنیا نیم لەو شوێنە نزیك بووینەوە یان نا.



ڕێویەکان شەکەت و ماندوو، بە ئارامی ڕێگەی تونێلەکەیان گۆڕی بۆ ڕووی زەوی. سەرترو سەرتر... لەناکاو شتێکی ڕەقیان هەست پێکردو نەیانتوانی زیاتر برۆنە پێشەوە. مام ڕێوی ڕۆیشتە سەرەوە تا بزانێ ئەو شتە رەقە چییە. لەبەر خۆیەوە وتی: دارە! تەختە دارە!

باوکە! مەبەستت چییە؟

مام ڕێوی وتی: ئەگەر هەڵەم نەکردبێ بەو مانایەیە، ئێمە دروست لە ژێر ماڵێکداین. بێدەنگ بن تا بە خێرایی سەیرێکی بکەم.



مام ڕێوی بە وردی پاڵی بە یەکێك لەو پارچە تەختانەوە نا بۆ لای سەرەوە. تەختەکە دەنگێکی ترسناکی لێوەهات، هەموویان لە ترسان چونەوە خوارەوەی تونێلەکە و چاوەڕوان بوون نەکا شتێکی خراپ روو بدات. بەڵام هیچ شتێکی خراپ رووی نەدا، دواتر مام ڕێوی پارچە تەختەی دووەمیشی بەرز کردەوە، زۆر بە ترسەوە سەری لە کەلێنەکە بردە دەر. و لەبەر شادی و دڵخۆشییەکی زۆر قیژاندی.

هاواری کرد: سەرکەوتم! هەر یەکەم جار سەرکەوتم! سەرکەوتم! مام ڕێوی لە کەلێنی ناو ژوورەکە هاتە سەرەوە، لە خۆشیان دەستی کرد بە هەڵبەز هەڵبەزو

سەما کردن. بە ئاهەنگەوە وتی: وەرنە سەرێ! وەرنە سەرێ و ببینن لە کوێن، ئازیزانم! چ دیمەنێك بۆ ریوییەکی برسی! سپاس بۆ خوا! ئای! ئای!

هەر چوار بەچکە ریوییەکان بە خێرایی لە تونێلەکە رۆیشتنە سەرێ، دیمەنێکی سەرسوڕهێنەر لە پێش چاویان بوو! کولانەیێکی گەورە و پڕ لە مریشك! مریشکی سپی، قاوەیی، رەش، لەوانەیە هەزار مریشك بن!

مام ریوی هاواری کرد: کولانە مریشکی ژمارە یەکی بوگیس. ئێرە ریك ئەو شوێنەیە کەلە بیری مندا بوو. چاك هەنگاوتم! هەر یەکەم جار! ئەوە سەرسام کەر نییە؟ لەوانەیە بتوانین پێی بڵێین زۆر ژیرانەیە!

بەچکە ریوییەکان لە خۆشیان وەکو کێویی یان(درندە) لێ هاتبوو. بەملاو بەولادا تەراتێنیان دەکرد و مریشکە گێلەکانیان دەرەتاند. مام ریوی فەرمانی کرد: سەبر بگرن! خۆتان شێت مەکەن! برۆنە دواوە! ئارام بن! دەبێ ئەو کارە بە باشی ئەنجام بدەین. لە پێش هەموو شتێك، هەمووتان ئاو بخۆنەوە!

هەموویان ڕایان کردە شوێنی ئاو خواردنەوەی مریشکەکان و ئاوی فێنك و خۆشیان خواردەوە. دواتر مام ریوی سێ مریشکی هەرەگەورە و قەڵەوی دەست نیشان کرد، زۆر ژیرانەو دەست بە جێ بە لمبۆزەکەی کوشتنی.

ئەو فەرمانی کرد: بگەرێنەوە ناو تونێلەکە. زووکەن! نابێ کات بە فیرۆ بدەین! چەند خێرا بجولێنەوە ئەوەندە زووتر دەتوانن شتێك بخۆن.



ئەوان یەك بە دوای یەكدا لە كەلێنی ژوورەكەوە رۆیشتنە خوارێ و زۆر بە خێرایی هەموویان دوبارە لە ناو تونێلە تاریكەكەدا بوون. مام رێوی دووبارە رۆیشتە سەرەوە، پارچە تەختەكانی ژوورەكەی وەك خۆی لێ كردەوە. ئەو كارەی زۆر بە وردی و ژیرانە ئەنجام دا، بە جۆرێك كەس هەستی پێنەدەكرد، كە پارچە تەختەكان لە شوێنی خۆیان جولاّون یان نا.

مام رێوی سێ مریشكە قەلّەوەكانی دا بە كوڕە گەورەكەی و پێی وت: كوڕم! خێرا بگەرێوەو ئەوانە بدە بە دایكت. پێی بلّێ میوانداریەك ساز كات. پێی بلّێ ئێمەش بە زووترین كات دێین. چەند كاری بچوكمان هەیە ئەنجامیان دەدەین و دەگەڕینەوە.

## دیاریەکی کتوپڕ بۆ ڕێوی خانم

بەچکە ڕێویەکە بە هەموو خێرایی خۆیەوە لە ڕێگەی تونێلەکەوە چووە ماڵێ و سێ مریشکی قەڵەوی لەگەڵ خۆی برد. لەخۆشیان خەنی ببوو. بە خۆی وت: سەبرکە! تەنیا سەبرکە دایکم ئەوانە ببینێت! دەبوایە ڕێگایەکی دوورو درێژ بە ڕاکردن بڕوات، ئەو ڕێگایەی بێ راوەستان بڕی و لە ناکاو ڕێوی خانمی لە بەردەمی قووت بۆوەو بە هانکە هانك هاواری کرد: دایکە! سەیرکە، دایکە! هەڵسە بڕوانە چیم بۆ هێناوی!

ڕێوی خانم کە لەبەر برسێتی بێ هێزترو لاوازتر ببوو، چاوێکی کردەوەو مریشکەکانی دیت. لەبەر خۆیەوە وتی: ئەوە خەون دەبینم، دووبارە چاوەکانی نوقاندەوە.





نەخێر دایکە! خەون نابینی! ئەوانە مریشکی راستین! ئێمە رزگارمان بوو! ئیتر لە برسان نامرین!

ریوی خانم چاوەکانی کردەوە و خێرا دانیشت و هاواری کرد: بەڵام رۆڵە خۆشەویستەکەم! ئەوانەتان لە کوێ...؟

بەچکە ریوی بە دەنگێکی بەرز وتی: لە بەخێوگەی پەلەوەری ژمارە یەکی بوگیس! ئێمە لە ژێر زەوەیەوە تونێلمان هەڵکەند. لە هەموو ژیانتدا ئەوەندە مریشکی گەورەو قەڵەوت نەبینیوە! باوکم وتی با میوانداریەك ساز کات. ئەوان زوو دەگەڕێنەوە. دیتنی خواردن ریوی خانمی بە هێز کردو هەڵساو وتی: میوانداری! ئاخ کە باوکت چەند ریویەکی سەرسوڕهێنەرە! زووکە ئازیزم، پەڕی مریشکەکان لێ بکەوە!

دوور لە وان! لە ناو تونێلەکە، مام ریوی سەرسوڕهێنەر دەیوت: ئێستاکە نۆبەی بەشەکەی ترە ئازیزانم! ئەوە ئیتر وەك ئاو خواردنەوە وایە! تەنیا تونێلێکی تر لێرەوە بۆ ئەوێ هەڵکەنین!

بۆ کوێ باوکە؟

ئەوەندە پرسیار مەکە، هەر هەڵکەنە!

# گۆڕکەن

مام ڕێوی و سێ بەچکەکەی، بە خێرایی هەڵیان دەکەند. هێندە خۆشحاڵ بوون کە هەستیان بە ماندوویی و برسێتی نەدەکرد. دەیانزانی کە میوانداریەکی گەورە و نایاب بە ڕێوەیە، ئەو مەسەلەیەش کە بڕیار بوو مریشکەکانی بوگیس بخۆن، خۆشحاڵی دەکردن، بەجۆرێك هەر کە بیریان لێ دەکردەوە، پێکەنینیان دەهات. بە تایبەتی کە بیریان لەوە دەکردەوە ئەو خاوەن مەزرا قەڵەوە، لەسەر گردەکە دانیشتووەو چاوەڕوانە ئەوان بمرن لە برسان. لە کاتێکدا بێ ئاگا بوو لەوەی کە خواردنی شەوی بۆ ئامادە کردوون. هەستیان بە چێژو خۆشی دەکرد. مام ڕێوی وتی: هەڵکەنن دەی، زۆر دوور نییە.

لەناکاو دەنگێکی بەرز لەسەرەوە وتی: کێ لە وێیە؟ ڕێویەکان هەڵبەزینەوە. خێرا تەماشای سەرەوەیان کرد و کاتێك بە وردی لەو کونە بچوکەی کە لە سەرەوەی تونێلەکە بوو، سەیریان کرد، دەم و چاوێکی درێژو نووك تیژو ڕەش و تووکاویان دەبینی.





مام ڕێوی هاواری کرد: گۆڕکەن!

گۆڕکەن هاواری کرد: ڕێوی ئازیز! ئەی خودایە، زۆر خۆشحاڵم لە کۆتاییدا یەکێکم پەیدا کرد. ئەوە سێ ڕۆژو سێ شەوە بە دەوری خۆم دا دەسوڕێمەوەو نازانم لە کوێم!

گۆڕکەن کونەکەی گەورەتر کردو کەوتە خوارەوە بۆ لای ڕێویەکان. گۆڕکەنێکی بچوکیش- کوڕەکەی- بە دوای ئەودا کەوتە خوارێ. گۆڕکەن بە خۆشحاڵی یەوە وتی: ئاگات لیٚ نییە لەسەر گردەکە چی روویداوە؟ هەموو شتێك تێکچووە! نیوەی دارستانەکە وێران بووە، چەکدارەکان گردەکەیان گەمارۆ داوە! هیچ کامێکمان ناتوانین بڕۆینە دەرەوە. هەتا بە شەویش! هەمووومان لە برسان دەمرین!

مام ڕێوی پرسیاری کرد: مەبەستت لە ئێمە کێیە؟ هەموومان کە لەو ژێرە دەژین، ئەمن و مشکە کوێرەو کەروێشك و ژن و منداڵەکانیان، تەنانەت دەڵەکیش کە هەندێك جار بە تەسکترین کوندا تێدەپەڕێت، خەریکە لە برسان دەمرێت. هەر ئێستاکە لەگەڵ خانمی دەڵەك و شەش بەچکەکەی لە کولانەکەی مندان. خوا دەزانیٚ چیمان بەسەر دێت، ڕێوی ئازیز! وابزانم کۆتاییمانە!

مام ڕێوی سەیری سیٚ بەچکەکەی کردو زەردەخەنەیەکی کرد. منداڵەکانیشی زەردەخەنەیەکیان بۆ کرد، کە نیشانەی نهێنییەك بوو. مام ڕێوی وتی: گۆڕکەنی ئازیزو پیرم! ئەو حاڵە خراپەی کە تووشی ئێوە بۆتەوە، هەمووی تاوانی من بوو...

گۆڕکەن بە توڕەییەوە وتی: دەزانم تاوانی تۆیە! خاوەن مەزراکان تا تۆ نەگرن کۆڵ نادەن. بەداخەوە ئێمەش گیرمان خواردووە. واتە هەموو ئەوانەی لەسەر گردەکە دەژین. گۆڕکەن دانیشت و باوەشی لە کوڕەکەی دا و بە ئارامی وتی: ئێمە دەمرین. هاوسەرە بەدبەختەکەی من ئەوەندە لاوازو بیٚ هێز بووە، ناتوانیٚ تۆزقالێك زەوی هەڵکەنیٚ.

مام ڕێوی وتی: هاوسەرەکەی منیش بەو شێوەیەیە، هەر ئێستاکە خەریکە بۆ من و منداڵەکان بە تامترین خواردن بە مریشکی قەڵەو چەورو چۆڵ دروست دەکات...

گۆڕکەن وتی: بەسە ئێتر! گاڵتەم پێی مەکە! پێم قەبوول ناکرێت!

یەکێك لە بەچکە ڕێویەکان هاواری کرد: ئەوە ڕاستە! باوکم گاڵتە ناکات. ئێمە یەك دنیا مریشکمان هەیە!

مام ڕێوی وتی: چونکە هەمووی سوچی من بووە، ئێوە بانگهێشت دەکەم تا لەو خواردنە بخۆن. من هەمووتان بانگهێشت دەکەم تا لەو میوانداریەدا بەشدار بن. تۆو مشکە کوێرەو کەروێشك و دەڵەك و هاوسەرەکانتان و هەموو منداڵەکانتان. خواردنەکە زۆرەو بەشی هەمووان دەکات و لەم ڕووەوە ئاسودە بن.

گۆڕکەن بە دەنگێکی بەرز وتی: ڕاست دەکەی؟ بەراستی وایە؟

مام ڕێوی سەری بردە بن گوێی گۆڕکەن بە هێواشی وتی: دەزانی ئێمە لە کوێ بووین؟

لە کوێ؟

دروست لە بەخێوگەی پەلەوەری ژمارە یەکی بوگیس!

نااااا!

بەڵێ! بەڵام ئەو شوێنە بە بەراورد لەگەڵ ئەو شوێنەی ئێستا دەمانەوێ بۆی بچین هەر هیچ نییە. گۆرکەنی ئازیز تۆ لە کاتێکی باشدا هاتی! دەتوانی لە هەڵکەندنی زەوی دا یارمەتیمان بدەی و، لەو ماویەشدا کوڕە گچکەکەت

دەگەرێتەوەو ئەو هەواڵە خۆشە دەداتە خانمی گۆڕکەن و ئەوانی تر. مام رێوی رووی لە گۆڕکەنی بچووك کردو وتی: پێیان بڵێ کە لە میوانداری مام رێوی بانگهێشت کراون. دواتر بیان هێنە خوارەوەو بەو تونێلەدا بڕۆ تا دەگەیە ماڵی ئێمە!

بەچکە گۆڕکەن وتی: بەسەر چاو مام رێوی! بەڵی گەورەم! هەر ئێستاکە! ئاخ! زۆر سپاس گەورەم! و بە خێرایی لەو کونەی کە لە سەقفەکەدا بوو گەڕایەوە و دیار نەما.



# کۆگای گەورەی بونیس

گۆڕکەن بەدەنگێکی بەرز وتی: ڕێوی گیان! کلکت چی بەسەر هاتووە؟

مام ڕێوی وتی: تکایە لەم بارەوە هیچ مەڵێ! ئەوە پرسێکی بە ئازارە.

ئەوان بە بێدنگی خەریکی هەڵکەندنی تونێلێکی دیکە بوون. گۆڕکەن وەستای هەڵکەندن بوو، یارمەتی ئەو دەبوو بە هۆی ئەوەی تونێلەکە بە خێرایی هەڵکەندرێ. بە خێرایی گەیشتنە ژێر زەویەك کە لە تەختە دروست کرابوو.

مام ڕێوی زەردەخەنەیەکی کرد نیشانەی سەرکەوتن بوو و ددانە سپی و تیژەکانی وەدەرخستن و وتی: ئەگەر هەڵەم نەکردبێ گۆڕکەنی ئازیز! ئێمە ئێستاکە لە ژێر مەزرایەکداین، کە هی بونیسە خڕەی ورگ زل و چەپەڵە. ئێمە دروست لە ژێر سەرنج ڕاکێشترین بەشی ئەو مەزرایەداین.



بەچکە ریویەکان لە کاتی لستنەوەی لێوەکانیاندا هاواریان کرد: مراویەکان و قازەکان! مراویە خۆش و بە تام و قازە گەورەو قەڵەوەکان!

مام ریوی وتی: زۆر ... راستە!

گۆرکەن پرسیاری کرد: بەڵام چۆن دەزانی ئێمە لە کوێین.

مام ریوی دیسان پێکەنی و ددانە سپیەکانی پتر وەدەر خست و وتی: سەیرکە! ئەمن بە چاوی نووقاویش دەتوانم ریگەی خۆم لەو مەزراییەدا بدۆزمەوە. رۆیشتنی من بە ژێر زەویدا، وەك رۆیشتن بەسەر زەویدا ئاسانە. خۆی گەیاندە سەرەوەو یەکێك لە پارچە تەختەکانی ژوورەکەی لادا، دواتر یەکی تر ئینجا سەری لە کەلێنی تەختەکان بردە دەرەوە.

لە کاتێکدا خۆی هەڵدەدایە ژوورەوە هاواری کرد: بەڵێ! ئەم جارەش سەرکەوتم! دروست ئامانجەکەم پێکا! ناوەراستی ئامانجەکە! وەرن سەیر کەن!

گۆرکەن و دواتر بەچکە ریویەکان بە خێرایی خۆیان هەڵدایە سەرەوە، وەستان و بە زاری داچەقاویان راما بوون. بەرادەیەك سەریان سورمابوو نەیاندەتوانی هیچ بڵێن. چونکە ئەو شتانەی لەبەر چاویان بوو بۆ ریویەك و گۆرکەنێك، خەون و خەیاڵ بوو. وەکو بەهەشتێك بوو بۆ ئاژەڵە برسیەکان.

مام ریوی بە دەنگێکی بەرز وتی: گۆرکەنی پیرو ئازیزم! ئێرە کۆگەی بەشکۆی بونیسە. ئەو شتە باشەکانی خۆی پێش ئەوەی بباتە بازار ، لێرە رادەگرێت.

لە دەوروبەری هەر چوار دیواری ژوورە گەورەکە، هەزارها و باشترین و قەڵەوترین قاز و مراوی پاکراو و ئامادەی لێنان، لە ناو قەفەزە و دۆڵابدا بوون کە

تا بنمیچی کۆگاکە هەڵچنرابوون، لەسەرەوەش لانی کەم سەد پارچەگۆشتی بەراز و، پەنجا پارچە بیکۆن*بە ئاسنی سەقفەکەوە هەڵواسرابوون.

مام ڕێوی لە کاتێکدا کە سەماو هەڵبەز و دابەزی دەکرد، بانگی کردن: تەنیا سەیر کەن! پێتان چۆنە، ها؟ خواردنێکی زۆر باشن!



سێ ریّوی بچوك و گۆڕكەنی زۆر برسی، قەڵمبازێكیان هاویشت و پڕیان دایە خواردنە خۆش و بە تامەكان.

مام ریّوی فەرمانی كرد: سەبر كەن! ئەو میوانداریە هی منە و دەبێ ئەمن دەست نیشانیان بكەم. ئەوانی تر كشانەوەو مڵچە مڵچیان گرتەوە. مام ریّوی بە دەوروبەری كۆگایەكەدا سوڕایەوەو بە نیگایەكی زانایانە ئەو پێشانگا بە شكۆیەی هەڵسەنگاند. لیكاوی دەمیشی وەك دەزوویوكی باریك بەلالێویدا دەهاتە خوارێ.

مام ریّوی وتی: ئێمە نابێ زێدەرۆیی بكەین. نابێ بدۆرێین! نابێ بێڵن ئەوانە بزانن ئێمە چی دەكەین. دەبێ رێك و پێك بین و تەنیا چەند پارچە گۆشتی باش لەگەڵ خۆمان ببەیین. لەبەر ئەوە بۆ دەستپێك چوار دانە مراوی ناسك و قەڵەو هەڵدەگرین. و لە ناو قەفەزەكەی دەریهێنان. ئای! ئەوانە چەند قەڵەو و نایابن! بێگومان بونیس لە بازار پارەیەكی باشی لە وانە دەست دەكەوێ... دەی، گۆڕكەن، یارمەتیم بدە تا بیان هێنمە خوارەوە. منداڵینە ئێوەش دەتوانن یارمەتیمان بدەن... لەوێ... ئەی خوا گیان، سەیر كەن چۆن ناودەمیان پڕبووە لە ئاو...و ئێستا... پێم باشە چەند قازایش هەڵگرین... سی دانە بەسە... قازە گەورەكان هەڵدەگرین... ئای ئای، ئێوە هیچ كات ئەو قازە باشانە لە ریستۆرانی پاشاشدا نابینن... زۆر بە هێواشی... ئەوە ریگاكەیەتی... چەند دانە بەرازیش پێتان چۆنە... ئەمن شەیدای گۆشتی بەرازم، ئەی تۆ گۆڕكەن؟... تكایە ئەو پەیژەم بۆ بێنن.

مام ڕێوی ڕۆیشتە سەر پەیژەکە و سێ بەرازی نایابی هێنایە خوارێ. تۆ **بیکۆن**یشت پێی خۆشە؟ گۆرکەن لە خۆشیان سەمای دەکرد، بە دەنگێکی بەرز وتی: من شێت و شەیدای بیکۆنم. بیکۆنێکیش بێنە. لە سەرەوە، ئەوەی کە گەورەیە.



بچوکترین بەچکە ڕێوی وتی: باوکە، گێزەریش بێنە، ئێمە دەبێ هەندێکیش گێزەر ببەیین.

مام ڕێوی وتی: شێت بووی! بۆخۆت دەزانی کە ئێمە هیچ کات شتی وا ناخۆیین.

بۆ خۆمان نا باوکە، بۆ کەروێشکەکان. ئەوان تەنیا سەوزە و گێزەر دەخۆن.
مام رێوی هاواری کرد: ئەی خوایە، راست دەکەی. چەند منداڵێکی زیرەکی! دە دەسك گێزەر هەڵگرە!



هێندەی پێی نەچوو ئەو شتە خۆشانە وەك گردێك لەسەر یەك هەڵچنران. رێویە بچوکەکان هاتنە پێشەوەو لوتیان جولاند، چاویان وەکو ئەستێرە دەدرەوشایەوە.

مام ڕێوی وتی: ئێستاکە ئێمە دەبێ لە برادەرەکەمان بونیس دوو دانە عارەبانەی باش کە لەو گۆشە دانراون، قەرز کەین.

ئەو و گۆڕکەن عارەبانەکانیان هێنا و مراوی و قازو گۆشتی بەرازو بیکۆن و گێزەریان بار کرد.

عارەبانەکانیان بە خێرایی بە کونی ژوورەکەدا بردە خوارێ و خۆشیان بە خلیسکە دوایان کەوتن، لە ناو تونێلەکە، مام ڕێوی دیسان پارچە تەختەکانی ژوورەکەی بە وردی لەسەر جێگەی خۆی دانایەوە. بە جۆرێك کە هیچ کەس نەیدەزانی ئەوانە لە شوێنی خۆیان جولاون.

ئەو لە سێ بەچکە ڕێویەکان دووانی دەسنیشان کرد و وتی: ئازیزانم! هەر یەکەو عارەبانیەك ببەن و خێرا بگەڕێنەوە لای دایکتان. سەلامی منی پێی بگەیەنن، پێشی بڵێین بۆ نانی ئێوارێ میوانمان هەیە، خاوخێزانی گۆڕکەن، خاوخێزانی مشکە کوێرە، خاوخێزانی کەروێشك، خاوخێزانی دەڵەك. پێشی بڵێین میوانداریەکەمان دەبێ زۆر بە شکۆ بێت، هەروەها بڵێن ئێمەش هەرکە ئەو کارە بچوکەی هەمانە بە ئەنجامان گەیاند، دەگەڕێنەوە.

وەڵامیان دایەوە: بەڵێ باوکە! بەسەر چاو! و عارەبانەکانیان ڕاکێشاو بە پەلە بە تونێلەکەدا ڕۆیشتنە خوارێ.

# گۆڕکەن دوو دڵە

مام ڕێوی بە دەنگێکی بەرز وتی: تەنیا شوێنێکی تر!

ئەو بەچکە ڕێویەی کە مابۆوە وتی: گرەو دەکەم دەزانم کوێیە. ئەو بچوکترین بەچکە ڕێوی بوو.

گۆڕکەن پرسیاری کرد: لە کویٚ؟

بەچکە ڕێوی وتی: باشە، ئێمە بۆ لای بوگیس ڕۆیشتین، بۆ لای بونیسیش چووین بەڵام نەچووینە لای بین. کەواتە دەبیٚ مەزرای **بین** بێت.

مام ڕێوی وتی: دروستە! بەڵام خۆ نازانی بڕیارە بۆ کام بەشەی مەزرای بین بچین.

گۆڕکەن و بەچکە ڕێوی بەیەکەوە وتیان: کام بەشە؟

مام ڕێوی وتی: ئەها! تەنیا سەبر کەن تا بۆ خۆتان ببینن. ئەوان لە کاتی هەڵکەندندا قسەیان دەکردو تونێلەکەش بە خێرایی بەرەوە پێش دەچوو.

لەناکاو گۆڕکەن وتی: ڕێوی گیان ئەو کارانە هەر تۆزقالێك نیگەرانت ناکەن؟

مام ڕێوی وتی: نیگەرانم بکات؟ چ شتێك دەبیٚ نیگەرانم بکات؟

هەموو ئەو ... ئەو دزیانە.

مام رێوی دەستی لە هەڵکەندن هەڵگرت و بە جۆرێك چاوی لە گۆڕکەنەوە بڕیبوو وەك ئەوەی کە بە تەواوی شێت بوو بێت.

پێی وت: دۆستی پیرو کوڵکن و زەرد هەڵگەراوی من، تۆ لە هەموو جیهاندا کەسێك دەناسی کە منداڵەکانی لە برسان خەریکی مردنن، بەڵام ئامادە نەبێ چەند مریشکێك بدزێت؟

بۆ ماوەیەکی کەم بێدەنگ بوون. لە هەمان کاتدا گۆڕکەن بیری دەکردەوە.

مام رێوی وتی: تۆ زۆر لە بیری ئابرۆی خۆت دای.

گۆڕکەن وتی: چ عەیبێکی هەیە کە مرۆڤ ئابرۆی خۆی بپارێزێت؟

مام رێوی وتی: سەیرکە! بوگیس و بونیس و بین لە دەرەوە چاوەڕوانن بمانکوژن. هیوادارم لەمە تێبگەی.

گۆڕکەنی میهرەبان وتی: رێوی گیان، تێدەگەم، بەراستی تێدەگەم.

مام رێوی وتی: بەڵام خۆ قەرار نییە ئێمەش وەك ئەوان بین. ئێمە نامانەوێ بیانکوژین.

گۆڕکەن وتی: من بەراستی نامەوێ بە و شێوەیەی لێ بێت.



مام ڕێوی وتی: ئێمە هەر بیریش لەو مەسەلانە ناکەینەوە. زۆر ئاسانە! هەندێك خواردن لێرەو لەوێ هەڵدەگرین تا خۆمان و ماڵ و منداڵمان زیندوو ڕاگرین، ڕاست دەکەم؟

گۆڕکەن وتی: وا بزانم هیچ ڕێگەیەکی ترمان نییە.

مام ڕێوی وتی: ئەگەر ئەوان بیانەوێ خراپە بکەن، لێگەڕێ بابیکەن. ئێمە لەو خوارەوە لایەنگیری ئاشتی و ئەخلاقین. گۆڕکەن کە سەری بە لایەکدا خوار کردبۆوە، زەردەخەنەیەکی بۆ مام ڕێوی کردو وتی: ڕێوی گیان، من تۆم زۆر خۆش دەوێ.

مام ریوی وتی: سپاست دەکەم، دەبێ ئێستاکە بەردەوام بین لە هەڵکەندن.

پێنج خولەك دواتر، پەنجەکانی گۆڕکەن بە شتێکی رەق و لوس کەوت و وتی: ئەی خوایە، ئەو شتە چییە؟ وەك دیوارێك رەقە کە لە بەرد دروست کرابێ. لەگەڵ مام ریوی گلەکەیان لابرد. دیوارێك بوو. بەڵام لە خشت دروست کرابوو، نەك لە بەرد. دیوارەکە رێك لە بەردەمی ئەواندا بوو و رێگەی لێ بەستبوون.

گۆڕکەن وتی: چ کەسێك لە ژێر زەوی دیواری دروست کردووە؟

مام ریوی وتی: زۆر سادەیە. ئەو دیوارە ژێر زەمینێکە ئەگەر هەڵە نەبم، دروست ئەو شوێنەیە کە من بە دوایدا دەگەڕێم.

## کۆگای نهێنی شەربەتی سێوی بین

مام ڕێوی بە باشی لە دیوارەکە ورد بۆوە. بینی چیمەنتۆی نێوان خشتەکان رزیوەو بە ئاسانی ورد دەبێ و دەروخێت. لەگەڵ ئەوەشدا توانی بەبێ کێشە خشتێك شل کاتەوەو لە شوێنی خۆی بیهێنێتە دەرەوە. لە ناکاو دەم و چاوێکی باریکەڵەو بە سمێڵ لە کونی خشتەکە دەرپەڕی و هاواری کرد: بەدەرکەون! بۆتان نییە بێنە ئێرە! ئێرە تایبەتە!

گۆڕکەن وتی: ئەی خوایە! ئەو مشکە!

مام ڕێوی وتی: گیانلەبەرێ بێ چاوورووو! دەبوو بم زانیبایە لەو خوارەوە لە شوێنێك دەتدۆزمەوە!



مشك هاواری کرد: برۆن لێرە! دەی! ئێرە هی منە!

مام ڕێوی وتی: بێدەنگ بە!

مشك هاواری کرد: بێدەنگ نابم! ئێرە هی منە! یەکەم جار ئەمن ئێرەم پەیدا کردووە.



مام رێوی زەردەخەنەیەکی سەرکەوتوانەی کرد بە جۆرێك کە ددانە سپیەکانی دەدرەوشانەوە. دواتر بە نەرمی وتی: مشکی ئازیز! زۆرم برسی یە و ئەگەر زوو لانەچی حەپەلوشت دەکەم!

ئەو قسەیە زۆر کاریگەر بوو مشکەکە بە خێرایی کشایەوەو بزر بوو. مام رێوی پێکەنی دەستی کردەوە بە دەرهێنانی خشتی تر لە دیوارەکە. کاتێك کونەکە گەورەتر بوو، لە وێوە خۆی خزاندە ژوورەوە. گۆڕکەن و بەچکە رێوی دوای مام رێوی کەوتن.

ئەوان لە ژێر زەمینێکی تاریك و شێداری زۆر گەورەدا بوون. مام رێوی هاواری کرد: خۆیەتی!

گۆڕکەن وتی: چی خۆیەتی؟ خۆ ئێرە بەتاڵە!

بەچکە رێوی لەو کاتەی کە لە تاریکایەکەی ڕامابوو، پرسیاری کرد: عەلەشیشەکان لە کوێن؟ وەمدەزانی کە بێن عەلەشیش بەخێو دەکات.

مام رێوی وتی: ئەو بەخێوکەری عەلەشیشە، بەڵام ئێمە ئێستا عەلەشیشمان ناوێت. بە ئەندازەی پێویست خواردنمان هەیە.

کە واتە ئێمە چیمان دەوێ، باوکە؟

مام رێوی وتی: بە باشی سەیری دەوروبەرت بکە، شتێکی سەرنج راکێش دەبینی؟

گۆڕکەن و بەچکە رێوی چاویان بڕیبوو ئەو کەش و هەوا نیمچە تاریکە. هەر کە چاویان لەگەڵ تاریکیەکە ڕاهات، ئەو هەموو شوشە گەورەیان بینی، کە لە چوار دەوری دیوارەکاندا لە ناو قەفەس دا دانرابوون.

بە هەڵەدا نەچووبوون، شوشە بوون، سەدان شوشە و لەسەر هەرکامێکیان وشەی شەربەتی سێو نوسرا بوو.

بەچکە ریوی خۆی هەڵداو هاواری کرد: ئاخ باوکە! سەیرکە چیمان پەیدا کرد! ئەو شووشانە هەموویان شەربەتی سێون.

مام ریوی وتی: زۆر... راستە.

گۆڕکەن بە دەنگێکی بەرز وتی: لەرادەبەدەر سەر سوڕهێنەرە!

مام ریوی وتی: کۆگەی نهێنی شەربەتی سێوی بین، بەڵام ئازیزانم، زۆر ئاگادار بن هیچ دەنگێکتان لێ نەیەت. ئەو کۆگەیە دروست لە ژێرماڵەکەیەتی.

گۆڕکەن وتی: شەربەتی سێو بە تایبەتی بۆ گۆڕکەنەکان باشە. ئێمە وەکو دەرمان بەکاری دێنین، یەك پەرداخی گەورە، رۆژێ سێ جار لەگەڵ نان و پەرداخێکیش پێش نووستن.

مام ریوی وتی: ئەوانە دەتوانن میوانداریەکەمان، بکەن بە جەژنێکی گەورەو شکۆدار.

لەو کاتەی کە ئەوان پێکەوە دەدوان، بەچکە ریوی یەکێك لە شوشەکانی دەرهێنا و خواردیەوە. ئەو کە هەناسەی بۆ نەدەهات، وتی: بە! بە! هەی! سەیر کەن کە ئەو شەربەتە شەربەتێکی روون و گازداری سێو نییە و، لە هەموو دوکانێك پەیدا نابێت. ئەوە ئەسڵییە، جۆرە خواردنەوەیەکی خاتونی ماڵەوەیە کە هەم گەروو دەسوتێنێ و هەمیش مەعیدەی وەجۆش دەێنێ.

بەچکە رێوی بە هەناسە بڕکێ وتی: ئای، ئاااای، ئەو شەربەتە سێوە، ئەسڵی یە!

مام رێوی پڕی دایە شوشەکەو بە زاریەوە ناو وتی: ئیتر بەسە! قومێکی تەواوی خواردەوە و، لەگەڵ هەناسە هەڵکێشاندا ورتە ورتێکی کرد: لە رادەبەدەر باشە، زۆر باشە!

کاتێ کە گۆڕکەن شوشەکانی هەڵدەگرت و بە دەمییەوە ناو وتی: نۆرەی منە! شەربەتی سێوەکە لە ناو شوشەکەدا دەهات و دەچوو و بەقووڕە قووڕ بە گەروی دا دەڕۆیشتە خواری!. بە هەناسە بڕکەوە وتی: ئەم شەربەتە... وەك زێڕاوە! ئاخ رێوی گیان، ئەوە ... وەك ئەوە وایە تیشکی خۆر یان پەلکە زێرینە بخۆینەوە!

مشك بە قیژەوە وتی: ئێوە خەریکی دزیکردنن! هەر ئێستاکە داینێن! هیچتان بۆ من نەهێشتەوە. مشکەکە لەسەر بەرزترین قەفەزی کۆگایەکە دانیشتبوو، لە پشت شوشەیەکی گەورەوە چاوی لە خوارەوە بڕیبوو. لولەیەکی پلاستێکی لە ناو شوشەکەدا بوو، کە مشکەکە بۆ خواردنەوەی شەربەتی سێوەکە بەکاری دەهێنا.



مام ڕێوی وتی: تۆ زۆرت خواردۆتەوە!

مشکەکە وتی: خەریکی کاری خۆتان بن. ئەگەر ئێوەی زەبەلاح و ڕەزا گران، ئێرە تێکدەن، هەمووانمان دەگرن! ون بن لەبەرچاوم، لێم گەڕێن منیش لە ئارامیدا شەربەتی سێوەکەم بخۆمەوە.

هاوکات گوێیان لە دەنگی ژنێك بوو کە لە نهۆمی سەرەوەی خانووەکە بانگی دەکرد: **میبێل**! زووکە شەربەتی سێوەکان بێنە! خۆت دەزانی بەرێز **بین** پێی خۆش نییە دوا کەوێت! بە تایبەتی ئەو بە درێژایی شەو لە دەرەوە، و لە ناو چادردا بووە!

ئاژەڵەکان لە جێی خۆیان رامان، بێ جوڵە وەستا بوون و گوێیان تیژو خۆیان کروشم کردبووە. دەنگی کردنەوەی دەرگایەکیان بیست. دەنگی دەرگای سەر پلیکانەکان بوو، پلیکانەکە لە ناو ماڵەکەوە شۆڕدەبۆوە و تا ژێر زەمینەکە دەرۆیشت.

دواتر کەسێك لە پلیکانەکان هاتە خوارەوە.

## ژن

مام ڕێوی وتی: خێراکەن! خۆتان حەشاردەن! ئەو و گۆڕکەن و بەچکە ڕێوی خۆیان هەڵدایە سەر قەفەزێك و لە پشت ڕیزێك شوشەی گەورەی شەربەتی سێو، خۆیان حەشاردا! چاویان لە شوشەکانەوە بڕیبوو. ژنێکی زەبەلاحیان دیت بەرەو ژێرزەمینەکە هات. لە خوارەوەی پلیکانەکان وەستا، سەیرێکی ڕاست و چەپی خۆی کرد. دواتر گەڕایەوە، یەك سەر هاتە ئەو لایەی کە مام ڕێوی و گۆڕکەن و بەچکە ڕێوی خۆیان تێدا شاردبۆوە. دروست لە بەردەمی ئەوان وەستا، تەنیا بەربەستی نێوانیان، ڕێزێك شوشەی شەربەتی سێو بوو. هێندە نزیك بۆوە مام ڕێوی گوێی لە دەنگی هەناسەکانی بوو، لە کەلێنی نێوان دوو شوشەوە سەیری کرد و بینی ژنەکە تیرۆکێکی بە دەستەوەیە.



ژنەکە هاواری کرد: ئەمجارە بەرێز بین چەندانەی دەوێت؟ لە سەرەوەی پلیکانەکان دەنگێکی دیکە وەڵامی دایەوە: دووان سیانێك بێنە.

خانمی بین، دوێنێ چوار دانەی خواردەوە.

بەڵێ، بەڵام ئەمڕۆ هێندەی ناوێ، تەنیا چەند کاتژمێرێك دەمێنێتەوە. دەڵێت سەر لە بەیانی ئەمڕۆ، رێوی دێتە دەرێ، چونکە بێ خواردن رۆژێکی تر خۆی پێی راناگیرێ.

ژنەکە دەستی درێژ کرد و شوشەیەکی ئاوی سێوی لە ناو قەفەزەکە هەڵگرت. تەنیا شوشەیەك هەبوو لە نێوان ئەو شوشەی ژنەکە هەڵیگرت و، ئەو شووشەی مام رێوی خۆی لە پشتەوەی خۆی حەشاردابوو.

ژنەکە وتی: زۆر خۆشحال دەبم ئەو ئاژەڵە پیس و چەپەڵە بکوژن و لەسەر دەرگایماڵەوە هەڵیواسن. خاتوو بین، مێردەکەت بەڵێنی داوە کلکەکەی بدات بە من.

دەنگی سەرەوە پلیکانەکان وتی: بۆ نازانی کلکەکەی بە فیشەك لەت و پەت بووە.

مەگەر خەراپ بووە؟

دیارە خەراپ بووە. فیشەکێك بەر کلکی کەوتووە، بەڵام رێویەکە دەرباز بووە.

ژنە زەبەلاحەکە وتی: نەفرەتی! زۆرم پێی خۆش بوو کلکەکەی بۆ من بایە.

لە بری ئەوە دەتوانی سەرەکەی هەڵگری. سەرەکەی بئاخنی و بە دیواری ژوورەکەتەوە هەڵواسی. ئێستا خێراکەو شەربەتە سێوەکان بێنە.

ژنە زەبەلاحەکە وتی: بەسەر چاو خانمەکەم، ئەوا دێم. شوشەی دووەمیشی لە ناو قەفەزەکە هەڵگرت.



مام رێوی دەیزانی ئەگەر شوشەیەکی دیکە هەڵبگرێت، دەیان بینێت. ئەو هەستی بە هەڵلەرزینی بەچکە رێویەکە دەکرد کە لە ترسان خۆی بە باوکیەوە نوساندبوو.

دوودانە بەسە یان سێیان بێنم خاتوو بین؟

ئەی خوایە، میبێل، گرنگ نییە، خێراکە وەرە.

ژنە زەبەلاحەکە لەبەر خۆیەوە دەیوت: ئەگەر وایە دووان دەبەم، زۆر دەخواتەوە.

لەکاتێکدا دوو شوشە بەدستەوە و تیرۆکەکەی لە بن هەنگڵی نابوو، بەرەو لای پلیکانەکان رۆیشت.

لە خوارەوەی پلیکانەکان وچانێکی گرت، بەدەوربەری خۆی دا روانی و بۆنی کرد. دیسان خوارەوە مشکی لێیە. هەست بە بۆنەکەیان دەکەم خاتوو بین.

دەی ژەهریان بۆ رۆبکە، ژنەکە، ژەهریان بۆ رۆبکە! خۆ دەزانی ژەهرەکە لە کوێیە؟.

میبێل وتی: بەڵێ خانمەکەم: وردە وردە لە پلیکانەکان چوو سەرێ و دەرگاکەی بە توندی داخست.

مام رێوی وتی: خێراکەن، هەر یەکە شوشەیەك هەڵگرن و برۆن.

مشکەکە لەسەر قەفەزێکی بڵند راوەستابوو و هاواری دەکرد: دیتان وتم؟ خەریك بوو تووشبین، مەگەر نا؟ خەریك بوو یاریەکە بدۆرێنین. لێرە برۆن، هەر ئێستاکە! نامەوێ لەم دەوروبەرە بتان بینم! ئێرە ماڵی منە.

مام رێوی وتی: بڕیارە ژەهرخواردت بکەن.

مشکەکە وتی: قسەی پوچە! ئەمن لێرە دادەنیشم و سەیری ئەو ژنە دەکەم کە خەریکی ژەهر رۆکردنە. ئەو هەرگیز ناتوانێ من بگرێت.

مام رێوی و گۆڕکەن و بەچکە رێوی هەریەکە و شوشەیەکیان هەڵگرت و ڕایان کرد، کە لە کونی دیوارەکە دەرۆیشتن دەرەوە وتیان: خواحافیز ئەی مشك! سوپاست دەکەین بۆ ئەو شەربەتە سێوە نایابە!

مشکەکە هاواری دەکرد: دزەکان! چەتەکان!

## میوانداری گەورە

ئەوانی تر لە ناو تونێلەکەدا چاوەڕوان بوون تا مام ڕێوی خشتەکانی دیوارەکە بخاتەوە شوێنی خۆی. لەو کاتەدا، لەبەر خۆیەوە دەیوت: هێشتا تامی شەربەتی سێوەکە لە بن زمانمە، مشکێکی چەند بێ چاو ورووو بوو.

گۆڕکەن وتی: ڕەوشتێکی خراپی هەیە. مشکەکان هەموویان بەدڕەوشتن. تاکو ئێستا مشکێکی ڕەوشت بەرزم نەبینیوە.

مام ڕێوی لە کاتێکدا دوایین خشتی لە شوێنی خۆی دادەنایەوە، وتی: زۆری خواردبوو. باشە، ئێستا وەڕێکەون! بەرەو ماڵەوەو میوانداری!

شوشەکانی شەربەتی سێویان هەڵگرت و وەڕێکەوتن. مام ڕێوی لە پێشەوە دەڕۆیشت، بەچکە ڕێوی بە دوایدا و گۆڕکەنیش لە دواوەی هەمووان. بەم شێوەیە لە تونێلەکەدا بەرەو پێشەوە دەڕۆیشتن...بەو ڕێڕەوەدا تێپەڕین کە دەگەیشتە کۆگە نایابەکەی بونیس،... بە بەخێوگەی پەلەوەری ژمارە یەکی بوگیس دا ڕۆیشتن و دواتر بەرەو ماڵ، بۆ ئەو شوێنەی کە دەیزانی ڕێوی خانم چاوەڕوانیانە.



مام رێوی هاواری کرد: بەم شێوەیە بەردەوام بن، ئازیزانم! وا گەیشتین. بیر لەوە بکەنەوە کە لە کۆتایی تونێلەکە چ شتێك چاوەڕوانمان دەکات! بیر لەوە بکەنەوە لە ناو ئەم شوشانەدا چ شتێك لەگەڵ خۆمان دەبەینەوە ماڵێ. ئەمەش رێوی خانمی بێ چارەو داماو زۆر خۆشحال دەکات.

مام رێوی لەگەڵ ئەوەشدا کە بە خێرایی دەڕۆیشت و ڕای دەکرد، ئاوازێکی کورتی دەوتەوە:

خێرا دەچمەوە ماڵێ
بۆ لای بووکە جوانەکەم
تا چیتر نەخۆش نەکەوێ
شەربەتی سێوی بۆ دەبەم
گۆڕکەنیش بە دوای ئەودا وتی:
خاتوو گۆڕکەنی داماو
لەبرسان رەقهەڵگەڕاو

شەربەتی سێوم هێناوە
تا ئاهیت بێتەوە بەر

کاتێك لە دوا لۆفە تێپەڕین، هێشتا هەر گۆرانیان دەوت، کە کتوپڕ چاویان بە سەرنج راکێشترین و سەیرترین دیمەن کەوت، کە تا ئەو کاتە نەیاندیبوو. میوانداریەکە دەستی پێکردبوو. ژوورێکی نان خواردنیان دروست کردبوو و لە ناوەراستی ژوورەکەدا لە دەورەی مێزێکی گەورە، بیست و نۆ ئاژەڵ دانیشتبوون:

ڕێوی خانم و سێ بەچکەکەی،
گۆڕکەن خانم و سێ بەچکەکەی،



مشکە کوێرەو خێزانی و چوار بەچکەکانی،
کەروێشك و خێزانی کەروێشك و پێنج بەچکەکەی،
دەڵەك و خێزانی و شەش بەچکەکەی،

سەر مێزەکە پڕ بوو لە گۆشتی مریشك، مراوی، قاز و گۆشتی بەراز، هەموویان خۆیان بەسەر خواردنە بەتامەکاندا خوارکردبۆوە.

ڕێوی خانم بە قەڵەمبازێك خۆی خستە ناو باوەشی مام ڕێوی و هاواری کرد: ئازیزم! نەمانتوانی سەبر بگرین. تکایە بمان بوورن! دوایی بەچکە ڕێویەکەی لە باوەش گرت، خێزانی گۆڕکەنیش باوەشی لە مێردەکەی داو، هەموویان یەکتریان لە باوەش گرت. لە خۆشحاڵیدا، شوشەکانی شەربەتی سێویان لەسەر مێزەکە دانا، مام ڕێوی و گۆڕکەن و بچووکترین بەچکە ڕێوی لە تەنیشت ئەوانی تر دانیشتن.

دڵنیام لەبیرتانە، چەند ڕۆژە هیچ کامێکیان هیچیان نەخواردووە و خەریکە لە برسان دەمردین. بۆ ماوەیەك بێدەنگی و کەس هیچی نەوت، تەنیا مشوهوڕی خواردن و جوین دەهاتە بەرگوێ. ئەوان شاڵاویان بۆ سەر خواردنە خۆشەکان بردبوو.

لە کۆتاییدا گۆڕکەن هەستایە سەر پێی، پەرداخێك شەربەتی سێوی بەرز کردەوەو وتی: داوا لە هەمووتان دەکەم ڕاوەستن و بە خۆشی دۆستی ئازیزمان، مام ڕێوی، کە ئەمڕۆ گیانی هەموومانی ڕزگار کرد، بخۆنەوە!

هەموویان هەستانە سەرپێ، پەرداخەکانیان بەرز کردەوەو هاورایان کرد: بژی مام ڕێوی! بژی مام ڕێوی، هەر بژی مام ڕێوی!



دواتر ڕێوی خانم بە شەرمەوە هەستاو وتی: نامەوێ وتار بدەم، تەنیا دەمەوێ بابەتێك بڵێم ئەویش ئەوەیە: هاوسەرەکەم ڕێویەکی سەرسوڕهێنەرە. هەموویان بە خۆشی یەوە دەستیان کرد بە چەپلە لێدان. دواتر مام ڕێوی هەستاو بەمجۆرە دەستی پێکرد:





ئەم خواردنە بەتامە...کەمێك وەستاو لەو بێدەنگیەدا مام ڕێوی خۆی ڕانا. هەموویان پێکەنین و چەپلەیان لێدا.

دواتر بەردەوام بوو: ئەم خواردنە بە تامە، لە پیاوەتی بەرێزان بوگیس و بونیس و بینە، دۆستەکانم! (پێکەنین و خۆشحاڵییەکە پتر بوو) هیوادارم ئێوەش بە ئەندازەی من بەدڵتان بوو بێت. دووبارە سەری خستەوە سەر سنگی.

گۆڕکەن وتی: زیاتر لەوەی کە بیری لیَ بکەیەوە.



مام ڕێوی لەو کاتەی پێدەکەنی ددانە سپیەکانی دەرکەوت، وتی: سوپاستان دەکەم! بەڵام هاوڕێیانم، ئێستاکە وەرن با بە جیدی بدوێین، وەرن لە بیری سبەی و دوو سبەی و ڕۆژەکانی دواتردا بین. ئەگەر برۆینە دەرەوە، دەکوژرێین، وایە؟

ئەوان هاواریان کرد: وایە.

گۆڕکەن وتی: هەر کە لاقمان بردە دەرەوە بە فیشەك لێمان دەدەن.

مام ڕێوی وتی: زۆر... ڕاستە. بەڵام ڕیگە بدەن پرسیارتان لێ بکەم، کامتان پێتان خۆشە برۆنە دەرەوە؟ هەموومان لە ژێر زەوی دەژین. یەك یەکی ئێمە. ئێمە لە چوونە دەرەوە بێزارین. دەرەوە پڕە لە دوژمن، ئێمە تەنیا لەبەر ئەوە دەرۆیشتینە دەرەوە، چونکە ناچار بووین خورادن بۆ ماڵ و منداڵمان پەیدا بکەین. بەڵام دۆستان ئێستاکە ئێمە بەرنامەیەکی نوێمان هەیە. تونێلێکی ئەمین کە دەگاتە ناو سێ دانە لە باشترین کۆگاکانی جیهان.

گۆڕکەن وتی: ڕاستە! من ئەو کۆگایانەم بینیوە.

مام ڕێوی وتی: ئێوەش دەزانن ئەوە مانای چییە؟ مانای ئیتر پێویست ناکات هیچ کەس بڕواتە دەرەوە، بۆ کەش و هەوایەکی کراوە!

هەراو هورياپەك لە دەوروبەری مێزەکە ساز کرا.

مام ڕێوی بەردەوام بوو: لەبەر ئەوە هەمووتان بانگهێشت دەکەم بۆ هەمیشە لێرە لەگەڵماندا بمێننەوە.

هەموویان هاواریان کرد: بۆ هەمیشە! خوایە گیان! چەند باشە!

کەروێشك بە خانمەکەی وت: ئازیزم! بیری لێ بکەوە! ئیتر هەموو تەمەنمان لە فیشەکی ئەوان بە دوور و لە ئاسایشدا دەژین. مام ڕێوی وتی: ئێمە گوندێکی ژێر زەمینی بە جادە و خانووی ئەمبەر و ئەوبەر دروست دەکەین. خانووی بە جیا بۆ هەمووان، بۆ گۆڕکەنەکان، مشکەکوێرەکان، کەروێشکەکان، دەڵەکەکان و

ڕێویەکان، منیش هەموو ڕۆژێ شتتان بۆ دەکرم و ئێمە هەموو ڕۆژێ وەکو پاشاکان خواردن دەخۆیین.

دوای ئەم وتانەی مام ڕێوی، خۆشی و شادی ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشا.



## له چاوەڕوانیدا

له دەرەوەی کونه رێویەکە، بوگیس و بونیس و بین له تەنیشت چادرەکانیان دانیشتبوون و تفەنگەکانیان لەسەر قاچیان دانابوو. باران دەستی پێکرد. ئاو له سەر و ملی ئەو سێ کەسە دەچۆڕایەوە بۆ سەر پێڵاوەکانیان.



بوگیس وتی: ئیتر زۆر لە خوارەوە نامێننەوە.

بونیس وتی: دەبێ ئێستا زۆر برسی بن.

بین وتی: راستە! هەر ساتێك ئەگەری هاتنە دەرەوەیان هەیە. تفەنگەکانتان ئامادە بکەن.

ئەوان لە تەنیشت کونە رێویەکە دانیشتن و چاوەڕوانی هاتنە دەرەوەی رێویەکان بوون. ئەوەندەی ئاگادارىم، ئەوان هێشتا هەر چاوەڕوانن.